# زیگمۆند فرۆید

**سی ڕەگەزی پێکهێنەری کەسایەتی مرۆڤ لە ڕوانگەی زیگمۆند فرۆیدەوە.**



**مامۆستای وانە: هەرومان فەریق**

- **کەسایەتی مرۆڤ لە روانگەی زیگمۆند فرۆیدەوە:**

(Id, Ego & Superego) من، خود و سەرووخود، لە تیۆری کەسایەتی زیگمۆند فرۆیددا، سێ رەگەز و بەشەپێکهێنەری کەسایەتی مرۆڤ پێکدەهێنن. ئەم سێ بەشە لە پەیوەندییەکی بەردەوام و ئاڵۆزدان لەگەڵ یەکتر.

- **بەشەپێکهێنەرەکانی کەسایەتی مرۆڤ( Id, Ego & Superego)**

هەرکام لەم بەشانە نەك تەنیا کاریگەری سەربەخۆ دادەنێن لەسەر کەسایەتی مرۆڤ، بەڵکو پێکەوەش پەیوەندییەکی بەهێ  زیان هەیە و لە خاڵێکی جیاوازی ژیانی تاکەکەسیدا دەردەکەون. ئەم بەشانە هەم مرۆڤ هان دەدەن بۆ دەستکەوتنی پێداویستییەکانی ژیان، هەم بە شێوەیەکی واقعیانەش کار لەسەر گونجان لەگەڵ ژیان دەکەن. با بزانین چۆن پێکەوە کار دەکەن.

**یەکەم: Id.**

- (id) : تاکە رەگەزی کەسایەتی مرۆڤە کە لە سەرەتای لەدایکبوونەوە ئامادەیە.
- ئەم لایەنە لە کەسایەتی تەواو نائاگایانەیە و رەمەکەکان و رەفتارە بنەڕەتییەکان لە خۆ دەگرێت.
- تاکە سەرچاوەی تەواوی وزەی دەروونی و ژێرخانی کەسایەتی مرۆڤە.
- لەسەر بنەمای چێژ کار دەکات و ئەگەر رازی نەکرێت، خەمبار دەبێت. وەك برسییەتی و ...
- لە هیچ لۆجیکێك پەیڕەوی ناکات. ئارام ناگرێت.
- رازیکردنی پێداویستییەکانی واقع بینانە نییە. و هەموو کارێك دەکات تا ...
- راستە مرۆڤەکان فێر دبن کە کۆنترۆڵی بکەن بەڵام ئەم رەگەزە هەمیشە وەك فۆرمە سەرەتاییەکەی خۆی دەمێنێتەوە.

دووەم: خود Ego:

- بەرپرسی پەیوەندییەکانە لەگەڵ واقعییەتی دەرەکی.
- وەها کار دەکات کە حەزەکانی Id بەشێوەیەکی گونجاو لە دنیای واقعیدا جێبەجێ بن.
- خود هەم لە ئاگا و هەم لە نائاگادا چالاکی هەیە.
- لەسەر ئەو بنەمایە کار کە حەزەکانی Id بە شێوەگەلی جێی ڕەزامەندی کۆمەڵگە جێبەجێ بن. هەڵی دەسەنگێنێت کە سود و قازاندەکانی کردەوەکانی مرۆڤ چین پێش ئەوەی ڕووداوێك روبدات.
- هەندێکجار بە درەنگخستنی جێبەجێکردنی پێداویستییەکانی Id ڕەنگە ئەو پێداویستیانەش جێبەجێ بن. کەواتە خود ڕێگە بە جێبەجێبوونی ئەو ڕەفتارە دەدات بەڵام لە نێوان بوونی حەز لە Id دا و جێبەجێبوونیدا هەڵوێستەیەك دەکات.
- فرۆید یەکەمیان بە ئەسب و دووەمیان بە ئەسبسوار دەچوێنێت...
- لە پەیوەندی خود و دنیای دەرەوەدا، ئێگۆ هەوڵ دەدات کە شتێك لە دنیای دەرەوەدا بدۆزێتەوە کە بگونجێك لەگەڵ ئەو وێنایەدا کە Id لە زەینی تاکەکەسدا دروستی کردووە.

نمونەی ئەوەی کە لەناو پۆل دانیشتوویت بەڵام زۆر برسیتە..

سێیەم: سەرووخود

- هەموو ئەخلاقییات و پێوەرەکان و ئایدیالەکان دەگرێتەوە.
- تێگەیشتنی ئێمە لە خێر وشەڕ،
- لە پێنج ساڵییەوە
- لە ئاگا و نائاگادا.

- دوو بەشی هەیە: منی ئایدیالی کە دۆخ و پێوەرەکانی رەفتاری باشە. ئەو رەفتارانەن کە لە رێگەی دایباب و کۆمەڵگەوە جەختیان لەسەر دەکرێتەوە. بەدواداچوونیان دەبێتە هۆی هەستی رەزامەندی، بەنرخبوون و کامڵبوون. ویژدان کە ئەو زانیاریانە دەگرێتەوە سەبارەت بەو شتانەی کە دایباب و کۆمەڵگە بە خراپی دەبینن. ئەم رەفتارانە زۆرجار رێگەپێدراو نین کە ئەنجامدانیان سزا، تەمێ  هەستی تاوان و پەشیمانی لێدەکەوێتەوە.
- سەرووخود کارێك دەکات کە رەفتاری ئێمە بێ کەموکورتی بێت و لە شارستانییەتەوە نزیك ببێتەوە. هەموو هەولێك دەکات کە حەزە نامۆکانی  Id سەرکوت بکات. ئەو لە خەباتێکی بەردەوامدا دژی Ego هەوڵ دەدات کە ناچاری بکات بە لەسەر بنەمای پێوەرە ئایدیالییەکان رەفتار بکات نەك پێوەرە واقعییەکان.

**پەیوەندی نێوان هەر سێ بەشەپێکهێنەرەکەی کەسایەتی:**

- کلیلی هەبوونی کەسایەتییەکی تەندروست، هاوسەنگییە لەنێوان ئید، ئێگۆ و سەرووئێگۆ.
- سنورێکی دیاریکراو لە نێوان ئەم سێ بەشەی کەسایەتیدا نییە.
- هەمیشە لە ناو تاکەکەسدا، چالاك و بەردەوامم و کاریگەریان لەسەر هەموو لایەنەکانی کەسایەتی مرۆڤ هەیە.
- فرۆید بۆ تێگەیشتن لە دژیەکییە ناوەکییەکانی مرۆڤ چەمکی هێزی ئیگۆ بەکار دەهێنێت. کەسێك کە هێزی ئیگۆی بەرز بێت دەتوانێت ئەم فشارە تەحەمول بکات و بە پیچەوانەوە.
- ئەگەر هاوسەنگی نێوان ئەم سیانە تێك بچێت کێشە لە کەسایەتیدا دروست دەبێت. ئەو ناوی دەنێت کەسایەتییەکی نۆرمپشێو. واتە کەسێك کە لە نۆرمەکانیدا پشێوی هەیە. بۆ نمونە کەسێك کە ئیدەکەی زاڵە بەسەر هەموو بەشەکانی دیکەی کەسایەتیدا رەنگە بەرەو کەسێکی کۆنترۆڵنەکراو، هەڵچوونی و یا تەنانەت تاوانبار بڕوات. واتە کەسێك بە ئاڕاستەی رازی کردنی حەزو و ئارەزووەکانی.

- له لایەکی ترەوە رەنگە کاتێك کە سوپەرئیگۆ زاڵ دەبێت، کەسایەتییەك بەرهەم دێت کە تەواو ئەخلاقگەرایە و داوەری و حوکم دەدات. لەوکاتەدا کەسایەتییەکی سوپەرئێگۆ-زاڵ، رەنگە خۆی لە هەر شتێك دور بخاتەوە کە بە خراپیان دادەنێت. ئەم جۆرە لە کەسایەتیش رەنگە کێشەی زۆری لێبکەوێتەوە. ئەم کەسایەتییە زۆر رێز لە یاساکان و واقعییەتەکان دەگرێت و رەنگە زۆر وشك و دەمارگیر بێت. ئەم جۆرە لە کەسایەتی کە سوپەرئێگۆ بەسەریدا زاڵە، رەنگە بەرامبەر بە گۆڕانکاری زۆر هەست بە لاوازی بکات و هەستی دیاریکردنی باش وخراپ لەدەست بدات.